# گوڵبژێرێک لە وتە ناوازەکانی

# ئیبن قەییم

## دەربارەی خۆبونیادنان

کۆکردنەوە و ئامادەکردنی

حەمزە بوللوشی



وەرگێڕانی

قاسم سەلام

ناوی کتێب: گوڵبژێرێك له وته ناوازه‌كانی ئیبن قه‌ییم

كۆكردنه‌وه و ئاماده‌كردن: حه‌مزه بوللوشی

وه‌رگێڕانی: قاسم سه‌لام

پێداچوونه‌وه‌ی: سیروان مه‌حمود

دیزاینی به‌رگ: ناوه‌ندی ڕێنوێن

دیزاینی ناوه‌وه: زه‌رده‌شت كاوانی

نۆبه‌تی چاپ: یه‌كه‌م ٢٠٢١

چاپ: ناوه‌ندی ڕێنوێن

تیراژ: (١٠٠٠) دانه

ژماره‌ی سپاردن: له به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تیی گشتیی كتێبخانه گشتییه‌كان

ژماره (٢٠٢٨)ـی ساڵی (٢٠٢١)ـی پێ دراوه.





**ناوه‌ندی ڕێنوێن**




07511408868 -07501269689


hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com


سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یه‌كه‌م
به‌رامبه‌ر كاسۆمۆڵ - دوكانی ژماره (٦٦)

گوڵبژێرێک لە وتە ناوازەکانی

# ئیبن قەییم

## دەربارەی خۆبونیادنان

کۆکردنەوە و ئامادەکردنی

حەمزە بوللوشی

وەرگێڕانی

قاسم سەلام

# پێشەکیی وەرگێڕ

بەناوی پەروەردگاری بەرزو مەزن. سەڵات و سەلام لەسەر خۆشەویست و یارویاوەر و شوێنکەوتووانی تا ڕۆژی دوایی.

خۆشەویستان!

ئیبن قەییم یەکێکە لەو زانا گەورانەی کە کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر ناخ و دەروونی مندا دروست کردووە. هەرکاتێ کتێبێک، یاخود پەیڤێکی ئەوم دەکەوێتە بەرچاو، ئەو قەناعەتەم بۆ دروست دەبێ کە ئەم زاتە مەزنە زۆر جوان خوای ناسیوە. چێژێکی زۆر لە پەیڤینەکانی دەبەم.

لە پیاوچاکانم بیستووە و لە نووسینەکانیانم خوێندۆتەوە کە بەشێک لەو گوفتارانەی دۆستانی خوا دەیڵێن، یاخود دەیخەنە سەر پەڕەی کاغەز، ئیلهامگەلی ئیلاهین. واتە: ئەوە خوا خۆیەتی ئەو قسە شیرین و ناسک و پڕ لە ئەوینانە دەخاتە سەر زمانیان. بۆیە تەماشا دەکەین دوای ئەو هەموو ساڵە لە مردنیان، کەچی هێشتا نووسین و قسەکانیان لەنێو ئێمەدا زیندوون و بەزیندوییش دەمێننەوە.

بەڕێزان! ئەم کتێبە کۆکەرەوەی چەند وتە و پەیڤینێکی (ئیبن قەییم)ە لە چەند بوارێکی جیاجیای پەیوەست بە دونیا و دواڕۆژی هەریەکێکمان. ئامادەکاری کتێبەکە چەند ناوونیشانێکی ئامادە کردوون، پاشان لەژێر هەر ناوونیشانێکدا چەند وتەیەکی (ئیبن قەییم)ی ڕیز کردوون. منیش

دوای ئەوەی خوێندمەوە و کاریگەریی لەسەر ناخ و دەروونم دروست کرد، بڕیارم دا وەریان بگێڕم و پاشان هەوڵی بەچاپگەیاندنیان بدەم.

لە کارەکەمدا هەوڵم داوە وشە و دەستەواژەی ئەوتۆی تێدا بەکار بێنم کە هەموو ئاست و تەمەنە جیاوازەکان تێی بگەن و لێی حاڵی بن. بۆ وەرگێڕانی ئایەتەکانیش، گەڕاومەتەوە سەر پوختەی تەفسیری نامیی ماموستا مودەڕیس.

سەرەڕای ئەوە، لەپێناو بەهرەمەندکردنی زیاتری خوێنەر، لە سەرەتای کتێبەکەدا کورتەیەکم لەژیان و بەسەرهاتی ئەو زاتە بەڕێزە (ئیبن قەییم) زیاد کردووە، جگە لەمەش، بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی هەندێ دەستەواژە، چەند پەراوێزێکم لە خوارەوەی نووسیوە.

ماوەتەوە بڵێم ناوونیشانە عەرەبییەکە بەم شێوەیەیە: (من أقوال إبن القيِّم في تَطوير الذات) واتە: لە قسەکانی ئیبن قەییم دەربارەی خۆبەرەوپێشبردن. بەڵام من خۆبونیادنانم پێ پەسندتر بوو لە خۆبەرەوپێشبردن. لە کۆتاییدا ناوونیشانە کوردییەکەم بەم شێوەیەی ئێستا لێ کرد و ئاوام پێ گونجاوتر بوو.

کاری هیچ بەنیادەمێکیش بێ کەموکوڕی و ناتەواوی نییە. ئومێدی قەبوڵی لای پەروەردگار دەخوازم. هیوام وایە لە کەموکووڕییەکانم ببورێ و بمخاتە بەر ڕەحمەتی بێسنووری خۆی. پشتیوان بە خوا هەرکەسێک بیخوێنێتەوە، هەست بە گۆڕانکاری و چێژ و شیرینی دەکات لە ناخیدا.

**قاسم سەلام**

# ئیبن قەییم لە چەند دێڕێکدا

## ناو و ڕەچەڵەکی:

زانای فەقیە و ئیمام و موفتی و نەحوی، شەمسەددین ئەبو عەبدوڵلا موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکری کوڕی ئەییوبی کوڕی سەعدی کوڕی حەریزی کوڕی مەککی زورعی پاشان دیمەشقی حەنبەلییە.

## ناوبانگ و شۆرەتی:

ئەم ئیمامە بەڕێزە لەنێو زانایانی پێشین و دوایین بە (ئیبن قەییم) ناوبانگی دەر کردووە، هەندێکیان (جەوزی)شیان بۆ زیاد کردووە، بەتایبەت لەنێو زانایانی دوایین.

هۆکاری ناودەرکردنی بەم ناسناوەوە، دەگەڕێتەوە بۆ باوکی، باوکی (ئەبو بەکری کوڕی ئەییوب) ماوەیەکی زۆر بەڕێوەبەرو سەرپەرشتیاری قوتابخانەی جەوزییە بووە لە شاری (دیمەشق). پێی گوتراوە: (سەرپەرشتیاری جەزوییە - قیِّم الجوزية).

## لەدایکبوونی:

بەگوێرەی ئەوەی مەڕاغی لە (طبقات الأصوليين)دا باسی دەکات، ئیبن قەییم لە ساڵی شەشسەد و نەوەدویەک، لە ڕۆژی حەوتەمی مانگی سەفەر، لە شاری دیمەشق هاتۆتە دونیاوە.

## خێزانەکەی و چۆنیەتیی گەورەبوونی:

ئیبن قەییم لە ژینگەیەکی پڕ لە زانستدا گەورە بووە، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لە ژینگەیەکی لەبار بۆ فێربوونی زانست چ وەک قوتابی، چ وەک مامۆستا گەشەی کردووە و پێگەیشتووە. باوکی وەک ئەوەی ئیبن و کەسیر باسی دەکات: (شێخ و ساڵح و عابید و لێبڕاو بۆ خوا، ئەبو بەکری کوڕی ئەییوبی کوڕی سەعدی زورعی حەنبەلییە، هەڵسوڕێنەری مەدرەسەی جەوزییە بووە. پیاوێکی ساڵح و خواپەرست و خاوەن فەزڵ بووە، شتێ لە (دلائل النبوة)ی لە ڕەشیدی عامر بیستووە و خوێندووە. هەر لە مەدرەسەی جەوزییە لە شەوی یەکشەممە، نۆزدەی مانگی زیلحیجە، بە مردنێکی لەناکاو دونیا جێ دێڵێ و وەفات دەکات. بۆ پاشنیوەڕۆی ڕۆژی دواتر نوێژی لەسەر دەکرێ و لە (باب الصغير)دا دەنێژرێ. خەڵکێکی زۆر لە ناشتنیدا ئامادە دەبن و بە باشە و چاکە باسی دەکەن و ستاییشی دەکەن، ڕەحمەتی خوای لێ بێ)[١].

---

(١) البداية والنهاية (٩٥/١٤).

ئیبن قەییم لەژێر چاودێریی باوکیدا ژیاوە و لای ئەو قوتابی بووە، سەرچاوە و کتێبەکانی ژیاننامە، جگە لە باوکی باسیان لە هەندێ لە ئەندامانی خێزانەکەی ئیبن قەییم کردووە، بۆ نموونە زەینوددینی برای، ناوی: (زەینوددین ئەبولفەرەج عەبدوڕەحمان)ە، دوو ساڵ دوای شەمسەددین -ئیبن قەییم-ی برای لەدایک بووە، یەکێک بووە لە شێخەکانی ئیبن و ڕەجەبی حەنبەلی، لە شەوی یەکشەممە، هەژدەی مانگی زیلحیجەی ساڵی (٧٦٩)ک لە دیمەشق وەفاتی کردووە. لە گۆڕستانی (باب الصغير)دا نێژراوە.

یەکێکی دیکە لە ئەندامانی خێزانەکەی کە باسی کراوە، بریتییە لە کوڕەبراکەی (برازاکەی) عیمادەددین. عیمادەددین ئیسماعیک ئەبولفیداء کوڕی زەینوددین عەبدوڕەحمان. یەکێ بووە لە کەسایەتییە دیار و بەرچاوەکان، دواتر زۆربەی کتێبەکانی نێو کتێبخانەی ئیبن قەییمی مامی دەکەوێتە دەست ئەو. لە ڕۆژی شەممە، پازدەی مانگی ڕەجەبی ساڵی (٧٩٩)ک وەفاتی کردووە.

یەکێکی دیکە لە ئەندامانی خێزانەکەی بریتییە لە عەبدوڵڵای کوڕی. لە ساڵی (٧٢٣)ک لەدایک بووە. لە ساڵی (٧٥٦)ک وەفاتی کردووە، زۆر زیرەک و بیرتیژ بووە، بە دوو ڕۆژ سوڕەتی ئەعرافی ئەزبەر کردووە، لە ساڵی (٧٣١)ک واتە: ئەو کاتەی تەمەنی تەنها نۆ ساڵ بووە، وەک پێشنوێژ بەئەزبەرکراوی قورئانی لە نوێژدا بۆ خەڵکی خوێندووە. دوای وەفاتی باوکی، ئەرکی وانەگوتنەوە لە (الصَّدرية) دەخاتە ئەستۆی خۆی.

یەکێکی دیکە لە ئەندامانی خێزانەکەی بریتییە لە ئیبراهیمی کوڕی. ئیبراهیم فەقیە و نەحوی و موتقین بووە، لە ساڵی (٧١٦)ک لەدایک بووە و لە ساڵی (٧٦٧)ک وەفاتی کردووە. عیلم و زانستی لە باوکی و غەیری

باوکیشی وەر گرتووە، لە (الصَّدرية)دا هەم وانەی گوتۆتەوە و هەم فەتوای داوە. بە باشە و چاکە ناو و شۆرەتی لەنێو خەڵکیدا بڵاو بۆتەوە، لەسەر ڕێچکەی باوکی ڕۆشتووە، لە زانستی (نەحو)دا دەستێکی باڵای هەبووە، ئەلفییەی ئیبن مالیکی لە کتێبێکدا بە ناوی (إرشاد السالك إلى حلّ ألفية إبن مالك) شەرح کردووە، پیاوێکی دەوڵەمەند و خاوەن سەروەت و سامان بووە، ماڵێکی زۆری دوای خۆی جێ هێشتووە، بە نزیکەی هەزار درهەم هەژمار کراوە.

یەکێ لە شتە سەیر و سەمەرەکانی ئەو کوڕەی ئیبن قەییم ئەوەیە، لە وانەگوتنەوەدا کێشە و ململانێی لەگەڵ ئیبن و کەثیردا هەبووە، جارێکیان ئیبن و کەثیر پێی دەڵێ: (لەبەر ئەوەی من ئەشعەریم، کەیفت بە من نایە)! ئەویش بە ئیبن کەثیر دەڵێ: (ئەگەر لەسەرت تاوەکوو پێت (شەعر) بێت، خەڵک باوەڕ بەو قسەیەت ناکات کە دەڵێی ئەشعەریم، لە کاتێکدا ئیبن و تەیمیە شێخ و مامۆستات بووە!)[1].

## خوازیاربوونی بۆ زانست، گەشت و گەڕانەکانی، پیاهەڵگوتنی لەلایەن زانایان:

ئەوەی لە کتێبەکانی ئیبن قەییم قووڵ ببێتەوە، دەبینێ زانست و ماریفەتی ئەو زاتە لە بوارە جۆراوجۆرەکانی وەک: (یەکخواپەرستی، فیقە، ئوسوڵ، فەرموودە، تەفسیر، زمانەوانی، پزیشکیی، نەحو، فەڕائیز، کەلام، تەزکییە) دەریایەکی بێکەنارە. هەریەکێ لەو زانایانەی ژیانی ئەویان نووسیوەتەوە، ئەو شاهێدییەیان بۆ داوە.

---

(١) الدرر الكامنة (٦٠/١).

## ئیبن و کەثیر کە یەکێکە لە قوتابییەکانی ئەو، دەربارەی ئەو گوتوویەتی:

(فەرموودەی بیستووە و وەر گرتووە، سەرقاڵی زانست بووە، لە زانستە جۆراوجۆرەکاندا زەبردەست بووە، بەتایبەت زانستی تەفسیر و فەرموودە و ئوسوڵ. لەو کاتەی شێخولئیسلام ئیبن و تەیمیە لەساڵی (٧١٢)ک لە وڵاتی مسڕ دەگەڕێتەوە تا ئەو کاتەی وەفات دەکات، ئیبن قەییم پەیوەندیی توندوتۆڵی لەگەڵدا دروست دەکات و پێیەوە پەیوەست دەبێ. زانست و زانیارییەکی زۆری لێ وەر دەگرێ و شتی زۆری لێوە فێر دەبێ، دەیخاتە سەر ئەو زانست و زانیارییەی پێشتر بەدەستی هێناوە. تا وای لێ دێ لە زۆبەی زانستەکاندا دەبێتە یەکێ لە کەسە دەگمەن و ناوازەکان)[1].

## ئیبن ناسرەددینی دیمەشقی گوتوویەتی:

(ئیبن قەییم لە زۆربەی زانستەکاندا زاتێکی زەبردەست بووە، بەتایبەت تەفسیر و ئوسوڵی مەنتوق (وتراو) ئوسوڵی مەفهوم)[2].

## ئیبن ڕەجەبی حەنبەلی گوتوویەتی:

(ئیبن قەییم لە مەزهەبدا فەقیە بوو، ناوی دەر کردبوو، فەتوای دەدا، پەیوەست بوو بە ئیبن تەیمیە. لە زانستە ئیسلامییەکاندا خاوەن هونەر بوو. هەروەها لە تەفسیری قوڕئان و ئوسوڵ و فەرموودە و ماناکانی

---

(١) البداية والنهاية (٢٠٢/٤).

(٢) الرد الوافر على من زعم أن من سمى ابن تيمية شيخ الإسلام فهو كافر، ص ٣٥-٣٦.

فەرموودە و فیقە، زاناو شارەزا بوو. هەڵێنجانی هێندە ورد و دەقیقی دەکرد، کەس لەو ڕووەوە نەیدەگەیشتێ، بە هەمان شێوە لە عەرەبی و زانستی کەلام و نەحو، جگە لەوانەش دەستێکی زۆر باڵای هەبوو. هەروەها زۆر زانا و شارەزا بوو بە زانستی بەرەوخواچوون و قسەکانی ئەهلی تەسەوف و ئاماژە و وردەکارییەکانیان. لە هەر زانستێک لەو زانستانەی باسمان کرد، دەستێکی باڵای هەبوو)[١].

## شەوکانی لەبارەیەوە گوتوویەتی:

(ئیبن قەییم زاتێک بوو لە زانستە جۆراوجۆرەکاندا زۆر شارەزا بوو، زۆر لەپێش نزیکانی خۆیەوە بوو، ناوبانگ و شۆرەتی بە هەموو لایەکدا بڵاو بووبوویەوە. ماریفەتی ئەو بەرامبەر مەزهەبەکانی پێشین زۆر قووڵ و فراوان بوو)[٢].

## سیوتی گوتوویەتی:

(ئیبن قەییم ئەهلی نووسین و مونازەڕە و هەڵێنجان -إستنباط- بوو، لە تەفسیر و فەرموودە و ئەسڵ و لقوپۆپەکانی شەرع و عەرەبی، بوو بە یەکێ لە پێشەوا و ئیمامە گەورەکان)[٣].

---

(١) ذيل طبقات الحنابلة (٢/٤٤٨).

(٢) البدر الطالع (١/١٤٣).

(٣) بغية الوعاة (١/٦٣).

سەرەڕای ئەوەی باس کرا، لە ژیاننامەیدا دەبینین ئیبن قەییم بۆ بەدەستهێنانی زانست و زانیاری گەشت و گەڕانی زۆر نەبووە. لەوانەیە هۆکارەکەی بگەڕێتەوە بۆ ئەم چەند خاڵەی خوارەوە:

١- دیمەشق کە شوێنی نیشتەجێبوونی ئیبن قەییم بوو، لەو کات و ساتەدا کە ئەوی تێدا ژیاوە سەرچاوەی بەدەستهێنانی زانستە جۆراوجۆرەکان بوو. قوتابخانەی زۆری لێ بوو، ژمارەیەکی زۆر مامۆستا و شێخی گەورەی تیادا دەژیان، بۆیە جێی سەرسووڕمان نییە ئەگەر بگوترێ: دیمەشق لەو سەردەمەدا شوێن و مەئوای زانایان بووە. زانایان و زانستخوازانی شوێنەکانی دیکە بۆ فێربوون و زیادبوونی زانست و ماریفەتیان دەهاتنە دیمەشق.

٢- شێخولئیسلام ئیبن و تەیمییە یەکێ بوو لەو زاتانەی هاتە دیمەشق و لەوێ مایەوە. (ئیبن قەییم)یش ئەوەندە لەلای مایەوە، نزیکە لەبارەی پەیوەستبوونی ئیبن و لقەییم بە ئیبن و تەیمییەوە بگوترێ: ماوەیەکی درێژ خۆی بۆ ئاوخواردنەوە لە دەریای ئیبن و تەیمییەدا یەکلا کردەوە و بوو بە قوتابیی ئەو.

٣- یەکێکی دیکە لە هۆکارەکانی گەشتنەکردنی ئیبن و لقەییم لەپێناو بەدەستهێنانی زانست، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو لە سەردەمی کۆکردنەوە و نووسینەوەی زانستە ئیسلامییەکاندا ژیاوە، بۆیە زۆر سوودی لە نووسین و کتێبەکانیان بینیوە، هەر وەک لە کتێبەکانیدا دەر دەکەوێ[1].

٣- هۆکارێکی دیکە بریتییە لەوەی کە ئەو سەرەتا زانست و زانیاریی

---

(١) شێخ بەکر ئەبو زێد لە کتێبێکی سەربەخۆدا سەرژمێریی ئەو سەرچاوانەی کردوون کە ئیبن قەییم شتی لێوە نەقڵ کردوون، بریتین لە (٥٦٩) کتێب.

لە باوکی وەر دەگرت، وەک پێشتر باسمان کرد، باوکی هەڵسوڕێنەر و بەڕێوەبەری مەدرەسەی جەوزییە بوو. کەسێ لە شاری خۆیدا بتوانێ زانست و زانیاری بەدەست بێنێ و هۆکارەکانی بۆ بڕەخسێ، بێنیاز دەبێ لەوەی دوور بکەوێتەوە.

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئیبن قەییم لەپێناو بەدەستهێنانی زانست گەشت و گەڕانی نەکردبێ، بەڵکوو (زیاتر لە جارێک چۆتە شاری قاهیرە)[1]، لە چوونەکانی بۆ میسڕ سوودی زۆری بینیوە، وەک خۆی گوتوویەتی: {لە میسڕدا لەگەڵ گەورەترینی ئەو کەسانەی دیار و ناسراو بوون بە زانست و زانیاری، گفتوگۆ و مونازەرەم کرد}[2].

بە هەمان شێوە زیاتر لە جارێک چۆتە وڵاتی حیجاز. یەکێ لەو بەڵگانەی کە دەیسەلمێنن ئیبن قەییم سەفەری وڵاتی حیجازی کردووە، بریتییە لە کۆتا قسەکانی لە پێشەکیی کتێبی (مفتاح دار السعادة)، لەوێدا گوتوویەتی: {(پێشتر هەندێ قسە دەکات، پاشان دەڵێ): ئەم فەتح و کرانەوە خواییەم لە کاتی مانەوە و لێبڕان و خۆیەکلاکردنەوەم بۆ خوا لە ماڵەکەیدا بۆ پێش هات. بە شێوەیەک کە نەفسی زەلیلکردی خۆم بە هەژاری و زەبوونی خستە پێش دەرگاکەی، لەوێ (واتە: لە ماڵەکەیدا) بەیانییان و ئێواران خۆم دەخستە بەر شنەبای ڕەحمەتی ئەو، بەڕاستی بێئومێد نابێ کەسێ هەموو ئومێدی لەسەر ئەو هەڵچنێ و هەموو حاجەت و پێویستییەکانی بخاتە بەردەم ئەو}.

---

(١) السلوك لمعرفة الملوك (٨٣٤/٢).

(٢) هداية الحيارى (٨٧).

بەڵگەیەکی دیکە لەسەر ئەوەی کە گەشتی وڵاتی حیجازی کردووە:

{لە ڕۆژانی مانەوەمدا لە شاری مەککە دووچاری چەند نەخۆشییەکی جۆراوجۆر بووم، لەوێش هەر وەک شارەکانی تر هیچ دکتۆرێک نەبوو، بۆیە بە هەنگوین و ئاوی زەمزەم چارەسەری خۆم دەکرد، لەم دووانەدا شیفا و چارەسەری سەرسووڕهێنەرم بەدی کرد}[١].

ئەو زانا بەڕێزانەش کە ژیانی ئەویان نووسیوەتەوە، باسیان لە چوونی ئەو بۆ وڵاتی حیجاز کردووە. وەک ئیبن ڕەجەبی قوتابیی ئەو، نووسیویەتی: {چەندەها جار حەجی کردووە. لە مەککەدا ماوەتەوە. خەڵکی مەککە بەسەرسووڕمانەوە باسی عیبادەت و تەوافی زۆری ئەویان گێڕاوەتەوە}[٢].

جێی خۆیەتی باسی ئەوە بکەین کە ئیبن قەییم زۆر پێداگر بووە لەسەر ئەوەی لە گەشت و گەڕانەکانیدا سوود لە کات ببینێ، زانراوە لە ڕێگادا و لەو شوێنانەدا کە سەفەری بۆ کردوون، هەرچەندە دووریش بووبێ لە کتێبخانەکەی و نیشتیمان و زێدی خۆی، کەچی کتێبی تێدا نووسیون. لەو کتێبانەی کە لەماوەی گەشتەکانیدا نووسیونی، بریتین لە: (مفتاح دار السعادة ومنشور ولاية العلم والإرادة)، (زاد المعاد في هدي خير العباد)، (بدائع الفوائد)، (روضة المحبين ونزهة المشتاقين)، (تهذيب سنن أبي داود)، (الفروسية). دووریش نییە دوای گەڕانەوەی یان نیشتەجێبوونی لەو شوێنەی کە سەفەرەکەی بۆ کردووە، چاوی بە هەندێ شوێنی ئەو

---

(١) ص ١١٧- بە هەمان شێوە لە کتێبی (مدارج السالكين) (٥٧/١) باس لە گەشتێکی خۆی دەکات بۆ وڵاتی حیجاز.

(٢) ذيل طبقات الحنابلة (٤٤٩/٢).

نووسراوانەدا گێڕابێتەوە، یان لە هەندێ ئەو کتێبانەی نەقڵ کردبێ کە لە کاتی نووسیندا لەگەڵ خۆی بردوون.

## مامۆستاکانی:

ئیمامی ئیبن قەییم موتاڵای زۆر بوو، ماریفەتی فراوان بوو، لەوانەیە یەکێ لە هۆکارەکانی ئەمەش بریتی بێ لەوەی مامۆستای زۆری بوون، هەروەها هونەری جۆراوجۆری بوون بۆ وەرگرتنی زانست لێیان، هەریەک لەو مامۆستایانە خاوەنی زیرەکی و پسپۆڕیی جۆراوجۆر بوون، بەتایبەت یەکێ لەو شێخانەی کە زۆر سوودی لێ بینیون، بریتییە لە ئیبن و تەیمییە. ئیبن قەییم هەموو هۆکارێکی ڕەخساندبوو بۆ وەرگرتنی زانست لە ئیبن و تەیمییە، لەوانەیە گەورەترین هۆکاریش مانەوە و پەیوەستبوونی بێ بە ئیبن و تەیمییە تا کۆتایی ژیانی.

## ئیبن و ڕەجەب گوتوویەتی:

(چەندین جار تووشی بەڵا و تاقیکردنەوە و ئەزیەت بووە، کۆتا جاریش بەندکردنی بوو بەتەنیا لەگەڵ شێخ تەقیەددینی مامۆستای لە قەڵا، لەوێ ئازاد نەکرا مەگەر دوای مردنی مامۆستاکەی)[1].

---

(١) ذيل طبقات الحنابلة (٤٤٨/٢).

## ئیبن و حەجەر گوتوویەتی:

(دوای ئەوەی سووکایەتیی پێ کرا، لەگەڵ ئیبن و تەیمییەی مامۆستای لە قەڵادا بەند کرا، لەسەر پشتی وشتری بەقامچیلێدراو دەیانگێڕا، کاتێ مامۆستاکەی وەفاتی کرد، ئنجا ئازاد کرا)[1].

سەرەتای پەیوەندیکردن و پەیوەستبوونی ئیبن قەییم بە ئیبن و تەیمییەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی کە ئیبن و تەیمییە لە ساڵی (٧١٢) ک هاتە دیمەشق. ئەم پەیوەستبوون و لەلامانەوەیەی دەوامی کێشا تا ئەو ساڵەی ئیبن و تەیمییە تێیدا وەفاتی کرد، واتە: ساڵی (٧٢٨). کەواتە: بەیەکەوەبوونیان (١٧) ساڵی خایاندووە، لەو ماوەیەدا زانست و زانیاریی زۆری لێ وەر گرتووە، زۆریش پێی کاریگەر بووە، کتێبگەلێکی زۆری لەلا خوێندووە. گرنگترینی ئەو کتێب و نووسراوانە، وەک سەدەفی ئاماژەیان پێ دەکات، ئەمانەی خوارەوەن:

{المحرر، المحصول، (الأحكام)ی سەیفی ئامەدیی، (الأربعين)، (المحصّل)، زۆرێکیش لەو کتێبانەی لەلا خوێندووە کە لە نووسینی ئیبن و تەیمییە خۆیەتی}[2].

## لە مامۆستاکانی دیکەی ئیبن قەییم:

- أبو العباس، أحمد بن عبدالرحمن بن عبدالمنعم بن نعمة النابلسي الحنبلي ناسراو بە: (الشهاب العابر)، ساڵی (٦٩٧)ک وەفاتی کردووە.

---

(١) الدرر الكامنة (٢١/٤).

(٢) الوافي بالوفيات (٢/ ٢٧٠ – ٢٧١).

- إسماعيل، مجدالدين بن محمد الفراء الحراني، ساڵی (٧٢٩)ک وەفاتی کردووە. ئیبن قەییم دوای باوکی فەرائیزی لەلای ئەو مامۆستایەی خوێندووە، هەروەها ئەمانەشی لەلا خوێندووە: فیقە، (مختصر أبي القاسم الخرقي)، (المقنع)ی ئیبن قودامە، بەشێکی زۆری (الروضة)ی ئیبن قودامە.

- محمد شمس الدين، أبو عبدالله بن أبي الفتح البعلبكي الحنبلي، ساڵی (٧٠٩) وەفاتی کردووە. ئەمانەی لەلا خوێندووە: عەرەبی، (الملخص)ی ئەبولبەقا، (الجرجاني)، (ألفية إبن مالك)، زۆربەی هەرە زۆری (الكافية الشافية)، هەندێ لە کتێبی (التسهيل).

- محمد صفي الدين بن عبدالرحيم، بن محمد الأرموي الشافعي، ساڵی (٧١٥) وەفاتی کردووە. ئوسوڵی فیقە و عەقیدەی لەلا خوێندووە، لەگەڵ زۆربەی هەرە زۆری: (الأربعين) و (المحصل).

- محمد شمس الدين، أبو عبدالله بن مفلح بن مفرج المقدسي الحنبلي، ساڵی (٧٦٣) وەفاتی کردووە. یەکێ بوو لەو مامۆستایانەی کە ئیبن قەییم لە زۆربەی مەسەلەکاندا دەگەڕایەوە لای و پرسی پێ دەکرد.

- يوسف جمال الدين، أبو الحجاج بن زكي الدين عبدالرحمن القضاعي المزي، ساڵی (٧٤٢) وەفاتی کردووە. ئیبن قەییم لە زیاتر لە شوێنێک لە کتێبەکانیدا ستاییشی ئەو مامۆستایەی دەکات و بە (شيخنا) واتە: (مامۆستامان) وەسفی دەکات. وەک لە کتێبی (الفروسیە) لا (٨٧)دا گوتوویەتی: (مامۆستامان ئەبو لحەجاج حافز... هەواڵی پێ داوین).

## قوتابییەکانی:

وەک گوتراوە: قوتابی لاپەڕەیەکە لە مامۆستاکەی، ئیبن قەییم ئەوەندە شانازی و گەورەییەی بەسە کە قوتابییەکانی لە ئیمامە دیار و ناسراوەکانن، گەورەپیاوانی بژاردەن، بە کەسانی خاوەن فەزڵ و تەقوا و زانست شاهێدییان بۆ دراوە، لە بەناوبانگترینی قوتابییەکانی:

- زانا و حافز و ڕاڤەکاری قورئان، عیمادەددین ئیسماعیل ئەبو لفیدای کوڕی عومەری کوڕی کەثیری ئەلقورشی شافیعی، لە ساڵی (٧٧٤) وەفاتی کردووە.

ئیبن و کەثیر خۆی باسی خۆی دەکات و دەڵێ: (من لە هاوڕێ هەرە نزیکەکان و خۆشەویستترینی خەڵکی بووم لەلای)[١].

- عەللامە عەبدوڕەحمان زەینەددین، ئەولفەرەج کوڕی ئەحمەدی کوڕی عەبدوڕەحمان، ناسراو بە: (ئیبن ڕەجەبی حەنبەلی) لە ساڵی (٧٩٥)ک وەفاتی کردووە. ئیبن و ڕەجەب زۆر بەجوانی باسی ژیانی مامۆستاکەی کردووە و دەربارەی گوتوویەتی: (بەر لە وەفاتی بە زیاتر لە ساڵێک، پەیوەست بووم بە مەجلیس و دانیشتنەکانی. قەسیدەی (النونیة)م لە بابەتی سوننەت لەلا خوێند. هەروەها چەند شتێکی دیکە لە نووسراو و کتێبەکانی و جگە لەمانەشم لەلا خوێند)[٢].

- یەکێکی دیکە لە قوتابییەکانی، عەللامە موحەممەد شەمسەددین ئەبو عەبدوڵلا کوڕی ئەحمەدی کوڕی عەبدولهادی ئیبن قودامەی مەقدسییە. لە ساڵی (٧٤٤) وەفاتی کردووە.

---

(١) البداية والنهاية (٢٠٢/١٤).

(٢) ذيل طبقات الحنابلة (٤٤٨/٢ و ٤٥٠).

ئیبن و ڕەجەب باسی ئیبن قودامەی کردووە و بە یەکێک لە قوتابییەکانی ئیبن قەییم هەژماری کردووە، لە باسوخواسی ژیانیدا دەڵێ: (کەسانی خاوەن فەزڵ و گەورە ئەم زاتەیان بە گەورە دەگرت و دەبوونە قوتابیی ئەو، وەک: ئیبن عەبدولهادی و غەیری ئەویش)[1].

-عەللامە موحەممەدی کوڕی یەعقوبی کوڕی موحەممەد مەجدەددین، ئەبو تاهیر فەیروزئابادی شافیعی، خاوەنی فەرهەنگە بەناوبانگەکە، ساڵی (٨١٧) وەفاتی کردووە.

شەوکانی لەبارەیەوە گوتوویەتی: (ساڵی (٧٥٥) چووە دیمەشق، بوویە قوتابیی تەقی سوبوکی و کۆمەڵێکی دیکەی زۆر، کە ژمارەیان لە سەد زانا زیاترە، وەک: ئیبن قەییم و ئەوانەی لە چینی ئەون)[2].

## نووسراوەکانی:

شێخ بەکر ئەبو زێد ڕەحمەتی خوای لێ بێ بەدواداچوونی وردی بۆ ناوی دانراو و نووسراوەکانی ئیبن قەییم کردووە، گەیاندوویەتییە (٩٦) کتێب. زۆر بەوردی و تێروپڕی باسی کتێبەکانی کردووە و پێناسەی کردوون، ئاگاییشی داوە سەبارەت بەو کتێبانەی بەهەڵە دراونەتە پاڵ ئیبن قەییم و هیی ئەویش نین.

---

(١) ذيل طبقات الحنابلة (٢/ ٤٤٧ و٤٥٠).

(٢) البدر الطالع (٢/٢٥٤).

## کتێبە چاپکراوەکانی بریتین لە:

١- إجتماع الجيوش الإسلامية على غزو المعطلة والجهمية.

٢- أحكام أهل الذمة، هەر لەم کتێبەدا (شرح الشروط العمرية)ی وەک کتێبێکی سەربەخۆ دەر هێناوە.

٣- (أحكام المولود) یان (تحفة المودود).

٤- أسماء مؤلفات إبن تيمية.

٥- إعلام الموقعين عن رب العالمين.

٦- إغاثة اللهفان في حكم طلاق الغضبان.

٧- بدائع الفوائد، لەنێو ئەم کتێبەشدا دوو کتێبی تر بە شێوەی سەربەخۆ دەر هاتوون، کە بریتین لە: (تفسير المعوذتين) و (ذم الحسد وأهله).

٨- التبيان في أقسام القرآن، ناوی دیکەشی هەن وەک: (أقسام القرآن) و (إيمان القرآن).

٩- تهذيب مختصر سنن أبي داود.

١٠- جلاء الأفهام في فضل الصلاة والسلام على خير الأنام.

١١- جواب في صيغ الحمد.

١٢- الجواب الكافي لمن سأن عن دواء الشافي، ناسراوە بە (الداء والدواء).

١٣- حادي الأرواح إلى بلاد الأفراح، ناسراوە بە (صفة الجنة).

١٤- حكم تارك الصلاة.

١٥- الرسالة التبوكية، لەژێر ناوونیشانی: (تحفة الأحباب في تفسير قوله تعالى: المائدة) چاپ کراوە، هەروەها بە ناوونیشانی: (زاد المهاجر إلى ربه) چاپ کراوە.

١٦- روضة المحبين ونزهة المشتاقين. هەر لەم کتێبەدا کتێبی (ذم الهوى واتباعه) دەر هاتووە.

١٧- الروح. کتێبی (الرسالة القبرية في الرد على منكري عذاب القبر من الزنادقة والقدرية)ی لێ دەر هاتووە، هەروەها لەگەڵ کۆمەڵێک نامیلکەشدا بەیەکەوە بە ناوونیشانی (الهدية السعيدية فيما جرى بين الوهابية والأحمدية) چاپ کراوە.

١٨- زاد المعاد في هدي خير العباد. کتێبێکی دیکەشی لێوە دەر هاتووە بە ناوونیشانی (الطب النبوي)، هەندێکی تر ناویان ناوە (الهدي النبوي).

١٩- شفاء العليل في مسائل القضاء والقدر والحكمة والتعليل. هەندێکی دیکە ناویان ناوە: (القضاء والقدر).

٢٠- الصواعق المرسلة على الجهمية والمعطلة.

٢١- طريق الهجرتين وباب السعادتين.

٢٢- الطرق الحكمية في السياسة الشرعية، بە ناوونیشانی (الفراسة)ش چاپ کراوە.

٢٣- عدة الصابرين وذخيرة الشاكرين.

٢٤- الفروسية.

٢٥- الفوائد.

٢٦- فوائد الحديثية.

٢٧- الكافية الشافية في الإنتصار للفرقة الناجية، هەندێکی دیکە ناویان ناوە: (الشافية الكافية). بريتييە لە قەسیدەی نوونییە دەربارەی سوننەت.

٢٨- الكلام على مسألة السماع.

٢٩- الكلم الطيب والعمل الصالح، کە بريتييە لە: (الوابل الصيّب من الكلم الطيب).

٣٠- مدارج السالكين بين منازل ، نامیلکەیەکی لێ دەر هاتووە سەبارەت بە قسەکردنی لەسەر فەرموودەی: (بدأ الدين غريباً...) بە شێوەی سەربەخۆ چاپ کراوە.

٣١- مفتاح دار السعادة ومنشور ولاية العلم والإرادة.

٣٢- المنار المنيف في الصحيح والضعيف.

٣٣- هداية الحيارى في أجوبة اليهود والنصاري.

ئەمانە گرنگترین کتێبە چاپکراوەکانی ئیبن قەییم بوون، کتێبگەلی دیکەی هەن تا ئێستا چاپ نەکراون، زۆربەی هەرە زۆری ئەوانەی چاپ نەکراون دیار نین و ون بوون، هۆکاری ئەمەش شێخ ئەلبانی ڕەحمەتی خوای لێ بێ باسی دەکات و دەڵێ: (یەکێ لەو میرانەی کە لە سەدەکانی ڕابردوودا دەستی بەسەر دیمەشقدا گرت، پیاوێکی خاوەن ماڵ و دەسەڵات بوو. خاوەنی بیروڕای حلوول و ئیتیحاد بوو، بۆ سەرخستنی مەزهەبەکەی خۆی، هەموو دانراوەکانی ئیبن تەیمییە و ئیبن قەییمی قوتابیی کۆ کردەوە و سووتاندی. ئەگەر نەیتوانیبا قەناعەت بە خاوەنی کتێبەکە بکات بە سووتاندنی، ئەوا لێی دەکڕی، یاخود لێی وەر دەگرت. لەوانەیە هۆکاری دیکەشی گرتبێتە بەر بۆ لەناوبردنی ئەو نووسراوانە)[1].

---

(١) پێشەکی (الكلم الطيب) ص ٤.

## وەفاتی:

ئیبن قەییم، لە ساڵی (٧٥١)ک، شەوی پێنجشەممە، لە سێزدەی مانگی ڕەجەب، لە کاتی نوێژی عیشا، لە تەمەنی شێست ساڵی، وەفاتی کرد. بۆ بەیانییەکەی و لەدوای نوێژی نیوەڕۆ لە مزگەوتی ئەمەوی نوێژی لەسەر کرا. پاشان لە مزگەوتی جەڕاح، خەڵکێکی زۆر ئامادەی ناشتنی بوون، لە شاری دیمەشق و لە گۆڕستانی (الباب الصغير) لەلای باوکی نێژرا. ڕەحمەتی خوایان لێ بێ[1].

---

(١) ئەم پوختەیەم لە ژیانی ئیبن قەییم، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لە پێشەکیی کتێبی (جلاء الأفهام) دەرهێناوە، ئەویش لە چەند سەرچاوەیەکی خواستۆتەوە. (وەرگێڕ).




«هەرکەسێ پەروەردگاری بناسێ، ئەو ناسینە بە شێوەیەک سەرقاڵی دەکات نایپرژێتە سەر شوێنکەوتنی هەوا و ئارەزووەکانی»

«ئەوەندە شکۆ و پایەدارییەت بەسە کە تۆ بەندەی ئەویت، ئەوەندە فەخر و شانازییەشت بەسە ئەو پەروەردگاری تۆیە»

«پەروەرگاری بەرز و مەزن لە قورئانی پیرۆزدا بانگی بەندەکانی دەکات لە دوو ڕێگەوە بیناسن: یەکەمیان: ڕامان و وردبوونەوە لە دروستکراوەکانی، دووەمیان: تێفکرین و بیرکردنەوە لە ئایەتەکانی. یەکەمیان بریتییە لە بەڵگە و نیشانە بینراوەکان، دووەمیشیان بریتییە لە ئایەتە بیستراو و درکپێکراوەکان»

«لە گەورەترین نیشانەکانی ستەملەخۆکردن و نەفامی ئەوەیە: ڕێز و شکۆ و گەورەیی لە خەڵک بخوازی، کەچی دڵت بەتاڵ بێ لە بەگەورەگرتن و ڕێزگرتن لە پەروەردگار، تۆ لەبەر بەگەورەگرتن و ڕێزگرتن لە خەڵک خۆت لە چەندین حاڵ و بارودۆخی نەشیاو دەپارێزی و بەدوور دەگری، کەچی بە بۆنەی ڕێزنەگرتن و بەگەورەنەگرتنی پەروەردگار لات ئاساییە لەسەر هەمان ئەو حاڵ و بارودۆخە نەشیاوەدا بتبینێ»

«هەرکەسێ پشت هەڵکا لە خۆشویستن و بەندایەتی و گوێڕایەڵیکردنی پەروەردگار، دووچاری بەڵا و تاقیکردنەوەی بەندایەتی و کۆیلەبوون و خۆشویستن و خزمەتکردنی خەڵکی دەبێ»

«ئەگەر بەندە بەیانی و ئێوارەی بەسەردا هات و جگە لە خوا هیچ خەم و خەفەتێکی دیکەی نەبوو، خوا هەموو پێویستیی و حاجەتەکانی بۆ دەخاتە ئەستۆی خۆی، هەرچیی بۆ ئەو بەندەیە گرنگ و جێبایەخە، پەروەردگار خۆی بۆی جێبەجێ دەکات»

«کەسی نەزان لەلای خەڵکی سکاڵا لە خوا دەکات، ئەمەش ئەوپەڕی نەفامی و نەزانییە بەسکاڵالێکراو و سکاڵالەلاکراو، چوونکە ئەگەر پەورەردگاری خۆی بناسییایە، سکاڵای لێ نەدەکرد؛ بە هەمان شێوە ئەگەر خەڵکیشی بناسییایە، سکاڵای لەلا نەدەکردن»

«چێژ و لەزەت شوێنکەوتەی خۆشەویستییە. بە بەهێزبوونی خۆشەویستی ئەمیش بەهێز دەبێ و بە بێهێزبوونیشی بێهێز دەبێ. هەرکاتێک ئارەزووکردن و خۆشویستن و شەوق و تاسەی مەحبووب بەهێز بوو، لەزەت و خۆشیی ویساڵ و پێگەیشتن و چاوپێکەوتنی تەواوتر و کامڵتر دەبێ»

«لەگەڵ خوادا ڕاست بە، ئەگەر ڕاست بووی، ئەوا لەنێوان سۆز و لوتفی ئەودا دەژیت، (سۆز)ی ئەو دەتپارێزێ لە هەرشتێک کە حەزەری لێ دەکەیت؛ (لوتفی)شی ڕازیت دەکات لەئاست هەرشتێک کە بۆی تەقدیر و ئەندازەگیر کردووی»



«هەر کرێکارێک دەیەوێ بزانێ قەدر و ڕێزی لای گەورەکەی چەندە، با سەیری خۆی بکات و بزانێ گەورەکەی چ کارێکی پێ سپاردووە و بە چ کارێکەوە سەرقاڵی کردووە»



«بزانە! ڕێبوار ڕێگەی بەرەوخواچوون بە دڵ و بە هیممەتی دەبڕێ، نەک بە جەستەی. لە هەقیقەتدا تەقواش[1] تەقوای دڵە، نەک تەقوای ئەندامەکان»



---

(١) لە ئەسڵدا تەقوا وشەیەکی عەرەبییە، لە کوردیدا پارێزکاریی بۆ بەکار دێ، بەڵام هەندێ وشە لەبەر زۆر دووبارەبوونەوەیان وەک کوردییان لێ هاتووە و ماناکانیان ڕوونە، بۆیە ئێمەش وەک خۆی بەکارمان هێناوەتەوە. (وەرگێڕ)

«بەندە پەردەیەکی هەیە لەنێوان خۆی و خوادا (کە بریتییە لە سنووری شتە حەرامکراوەکان)، پەردەیەکی دیکەشی هەیە لەنێوان خۆی و خەڵکدا (کە بریتییە لە حەیا و ئابڕوو). هەرکەسێ پەردەی نێوان خۆی و خوا هەڵماڵێ[1]، خواش پەردەی نێوان ئەو و خەڵک هەڵدەماڵێ (واتە: حەیا و حورمەت و ئابڕووی لەنێو خەڵکدا نامێنێ)»

«سەیر نییە خزمەتکارێک خۆی بۆ خاوەنەکەی زەلیل و گوێڕایەڵ بکا و لە خزمەتکردنیدا تووشی بێزاری و بێتاقەتی نەبێ، چوونکە خزمەتکار حاجەت و پێویستییەکانی لای گەورەکەیەتی. سەیر ئەوەیە گەورە بەو هەموو بێنیازی و بێپێویستی و دەوڵەمەندییەی، کەچی خۆی لە خزمەتکارەکەی ڕەپێش بکا و بە جۆرەها چاکە و بەخشش دڵسۆزیی خۆی بۆ دەر بڕێ»

«سەیر نییە هەژار و خاوەن پێویستییەک ئەو کەسەی خۆش بوێ کە چاکەی لەگەڵ کردووە، سەیر ئەوەیە چاکەکار بابای هەژاری خۆش بوێ»

---

(١) واتە: سنوورەکانی ببەزێنێ. (وەرگێڕ)

«خوای بەرز و مەزن فەرموویەتی: [١]، واتە: بەرەوخوا ڕابکەن، حەقیقەتی ڕاکردنیش بریتییە لە هەڵاتن لە شتێک بۆ شتێکی دیکە، ئەمیش دوو جۆرە: هەڵاتنی خۆشبەختان، هەڵاتنی بەدبەختان. هەڵاتنی خۆشبەختان هەڵاتنە بەرەو خوای بەرز و مەزن، هەڵاتنی بەدبەختانیش هەڵاتنە لە خوا، نەک هەڵاتن بێ بۆی»

«بۆ بەندە پەروەردگارێک هەیە، هیچ چارێکی نییە، هەرچۆنێک بێ هەر پێی دەگا و ڕووبەڕووی دەبێتەوە،ماڵێکیش هەیە لە داهاتوویەکی نزیکدا تێیدا دادەسەکنێ، بۆیە پێویستە لەسەری پەروەردگاری ڕازی بکات بەر لەوەی بچێتەوە لیقای. ماڵەکەشی ئاوەدان بکاتەوە بەر لەوەی بگوازرێتەوە بۆی»

---

(١) الذاريات.

«ئەگەر ڕەگوڕیشەی ماریفەت لە زەویی دڵدا چەسپا، ئەوا درەختی خۆشەویستیی لێ دەڕوێ. کاتێکیش خۆی گرت و بەهێز بوو، ئەوا تاعەت و گوێڕایەڵیی لێ بەرهەم دێ، ئەو درەختە بەبەردەوام [1] واتە: هەموو کاتێک بەئیزنی ئەو خوایەی دروستی کردووە بەر دەدا و بەرهەمی دەبێ.»

«مەخلوق ئەگەر لێی ترسای، لێی ڕادەکەیت و دوور دەکەویتەوە، پەروەردگار ئەگەر لێی ترسای و سام و هەیبەتت لێی کرد، هۆگری دەبیت و لێی نزیک دەبیتەوە»

«لە دڵدا بێئۆقرەییەک هەیە بە ڕووکردنە خوا نەبێ دانامرکێتەوە، هەستکردن بە تەنیاییەک هەیە بە هۆگربوون و نزیکی لە خوا نەبێ لا ناچێ، دڵتەنگی و خەم و خەفەتێک هەیە بە دڵخۆشبوون بە ناسینی خوا نەبێ ناڕوا»

---

(١) إبراهيم.

«هەرکەسێ خوا بناسێ، تاسە و شەوقی بۆ دەبێ، لەبەر ئەوەی ماریفەت و ناسینیش کۆتایی نایە، کەواتە: تاسە و شەوقی عاریفیش کۆتایی نایە»





## لەبارەی چاکسازیکردن لە نەفس

«فەرزترین جیهاد جیهادی نەفس و هەوا و شەیتان و دونیایە. کەسێ ئەگەر جیهادی دوژمنە پەنهان و شاراوە و نادیارەکانی نەکردبێ، ئەوا ناتوانێ جیهادی دوژمنە دیار و ئاشکراکانی بکات»

«کەسێ خۆی بناسێ، ئەو خۆناسینە سەرقاڵی دەکات بە چاککردنی عەیبەکانی خۆی و ناپرژێتە سەر عەیبوعاری خەڵک»

«سەرکەوتن و سەرفرازی بۆ ئەو کەسەی ئەوەندە بە چاککردنی عەیبەکانی خۆی سەرقاڵە، ناپرژێتە سەر باسکردنی عەیبی خەڵک. قوڕ بەسەر ئەو کەسەی عەیبەکانی خۆی لەیاد کردووە و خۆی یەکلا کردۆتەوە بۆ شەوێنکەوتن و باسکردنی عەیبوعاری خەڵک. هیی یەکەمیان نیشانەی خۆشبەختیی خاوەنەکەیەتی و هیی دووەمیشیان نیشانەی بەدبەختی»



«تووڕەبوونت بە کۆت و زنجیری نەرمونیانی و لەسەرخۆیی ببەستەوە، چوونکە تووڕەبوون سەگێکی هارە، ئەگەر بەری بدەی و بەرەڵڵای بکەی، شتەکان خراپ دەکات و تێکوپێکیان دەدا»



«زەوی فیترەت پانوپۆڕ و فراوانە، گونجاوە بۆ هەر درەختێک تێیدا بچێنی و سەوز بێت، ئەگەر درەختی ئیمان و تەقوات تێدا چاند، ئەوا بەروبوومەکەی بریتیی دەبێ لە چێژ و شیرینیی ئەبەدی، خۆ ئەگەر درەختی جەهل و هەوا و ئارەزووی تێدا بچێنی، هەموو بەروبوومەکەت تفت و تاڵ و بێزلێکراو دەبێ»

# لەبارەی بەڵا و تاقیکردنەوە و ئارامگری

«هەرکەسێ خوا بۆ بەهەشت خەڵقی کردبێ، بەبەردەوام دیارییەکانی لە ناخۆشی و زەحمەتی و ناڕەحەتییەوە بۆ دێ. هەرکەسێکیش خوا بۆ ئاگر خەڵقی کردبێ، بەبەردەوام دیارییەکانی لە هەوا و ئارەزوو و خۆشییە کاتییەکانەوە بۆ دێ»

«هەرکەسێ کەماڵی ئاخیرەتی بۆ دەر کەوت و تەماشای کرد، فیراقی دونیای لەلا سەهل و ئاسان دەبێ»

«شەرت نییە هەموو جارێ بەڵا بۆ سزا و ئەشکەنجەی ئینسان بێ، بەڵکوو هەندێک جار بۆ پاک و پاڵفتە کردنیەتی»



«هەرکەسێ چاوێک ببڕێتە شیرینیی پارێزراوی و سەرنجی بدا، تاڵی و قورسیی ئارامگرتنی لەلا سووک و ئاسان دەبێ»



«کاتێ ئادەم سەلامی خوای لێ بێ ویستی بە هۆی خواردنی درەختەکەوە بەهەتاهەتایی لە بەهەشتدا بمێنێتەوە، بە دەرکردن لێی سزا درا. کاتێکیش یوسف سەلامی خوای لێ بێ بە هۆی ئەو کەسەوە کە خەونەکەی دیتبوو ویستی لە گرتووخاتە دەر بچێ، چەند ساڵێک تێیدا مایەوە[1]»



---

(1) کەواتە: هەموو ئەو شتانەی کە بەنیادەم دەیانخوازێ، پێویستە لە خوایان داوا بکا، بە پێچەوانەوە، ئەگەر لە غەیری خوای خواست، ئەوا دەبێتە دەرد و ئافەت و بەڵا بۆ ژیانی دونیا و ئاخیرەتی. (وەرگێڕ)

«ئیبلیس بە دەرکرانی ئادەم لە بەهەشتدا دڵخۆش و شادمان بوو، نەیزانی شۆڕبوونەوەی مەلەوانێکی زۆر شارەزا لە قووڵایی دەریادا بۆ دەرهێنانی گەوهەر و مرواری بەرزاییە، نەک شۆڕبوونەوە و نزمایی»

«ئەگەر پەروەردگار پەردەی نهێنییەکانی بۆ بەندەکەی هەڵماڵێ، پیشانی بدا کە چۆن کار و فرمانەکانی بۆ بەڕێوە دەبا و لە دایکی خۆی بۆی بەبەزەییترە، ئەوا دڵی بەندە بە خۆشەویستی خوا دەتوێتەوە و بە شوکرانەبژێری و سوپاسکردنی پارچەپارچە دەبێ»

## لەبارەی
## چاکسازیکردن لە دڵ

«وەک چۆن جەستە بە هۆی نەخۆشکەوتن سوود لە خواردن و خواردنەوە نابینێ، بە هەمان شێوە (دڵ)یش ئەگەر دووچاری نەخۆشیی ئارەزووپەرستی بوو، ئامۆژگاری تێیدا جێگەی نابێتەوە»

«دڵڕەقبوون بە هۆی زێدەڕۆییکردنە لە چوار شت: خواردن، نوستن، قسەکردن، تێکەڵاوی»

«(دڵ)یش وەک جەستە نەخۆش دەکەوێت، شیفا و چارەسەرییەکەی لە تۆبە و خۆپاراستندایە. هەروەها، بە هەمان شێوەی ئاوێنە تووشی لەککە و پیسی دەبێ، پاکژبوونەوەکەی لە زیکر و یادی پەروەردگاردایە، دووچاری بێ بەرگ و پۆشاکی دەبێت، بەرگ و پۆشاک و جوانییەکەی لە تەقوای خوادایە. برسی و تینوو دەبێ وەک چۆن جەستە برسی و تینووی دەبێ، خواردن و خواردنەوەکەی لە ماریفەت و خۆشەویستی و تەوەکول و ملکەچی و خزمەتکردندایە»

«دڵێک کۆت و بەند و پەیوەست بووبێ بە ئارەزوو، زوهد و وەرعی بۆ ناچێتە سەر[1]»

---

(١) واتە: تا کۆتایی تەمەنی ناتوانێ لەسەر زوهد و وەرع بەردەوام بێ. (وەرگێڕ)

«(دڵ) شەش شوێنی هەیە و حەوتەمی بۆ نییە، لەو شەش شوێنەدا هاتوچۆ دەکات، سێیانی نزمە، سێیانی بەرزە، سێ شوێنە نزمەکەی کە هاتوچۆی تێدا دەکات بریتین لە: دونیایەک کە بۆی ڕازاوەتەوە، نەفسێک خەیاڵ و خەتەرەی بۆ دروست دەکات، دوژمنێک وەسوەسەی بۆ دەکات - ئەم شوێنانە شوێنی ڕۆحە نزمەکانن، بەردەوام تێیاندا دێن و دەچن. سێ شوێنە بەرزەکەش بریتین لە: زانستێک کە بۆی ڕوون بۆتەوە، عەقڵێک کە ئاڕاستەی دەکات، پەرستراوێک کە دەیپەرستێ - دڵەکان لەم شوێنانەدا دێن و دەچن»

«بۆ بەندە هیچ سزایەک لە دڵڕەقبوون قورستر نییە»

«ئەوانەی دڵەکانی خۆیان بە دونیا سەرقاڵ کرد، ئەگەر بێت و بە خوا و ئاخیرەتیان سەرقاڵ کردبایە، ئەوا دڵەکانیان لە فەرماییشت و بەڵگە بینراوەکانی ئەودا جیلوەیان دەکرد. بە نهێنیی عەجیب و سوود و قازانجی نایابەوە دەگەڕانەوە لاشەی خاوەنەکانیان»

«هەرکەسێ سافی و پاکیی دڵی دەوێ، با خوای پەروەردگار بەپێشی هەوا و ئارەزووەکانی خۆی بخا»



«کاولبوونی دڵ لە ئەمینبوون لە سزای خوا و بێئاگاییدایە. ئاوەدانکردنەوەشی لە ترس و یادی خوادایە»



«جێی سەرسووڕمانە کەسێ حاجەت و پێویستییەکی دێتە پێش، حاجەت و پێویستییەکەی وای لێ دەکات ڕوو بکاتە خوا بۆ ئەوەی بۆی جێبەجێ بکات. کەچی لەبەر نەفامی و پشتکردن لە خوا خۆی ڕووبەڕووی ئەو پرسیارە ناکاتەوە کە بۆچی دڵی مردووە، دڵی خۆی لە نەخۆشییەکانی وەک: گومان و ئارەزووپەرستی چارەسەر ناکات. بەڵام دڵ ئەگەر مرد، ئەوا هەست بە سەرپێچیی پەروەردگاری ناکا»



«ئەگەر دڵ بە زیکر و یادی خوا نان درا، بە بیرکردنەوە و تێڕامانیش ئاو درا، هەروەها لە پیسی و دەغەڵیش پاک کرایەوە، ئەوا شتی عەجایەب و سەرسووڕهێنەر دەبینێ، حیکمەت و دانایی تێ دەئاخنرێ»

«هەرگیز خۆیەکلاکردنەوە بۆ خوا لە لایەک و حەزکردن بە مەدح و سەنای خەڵکی لەلایەکی تر لە دڵێکدا کۆ نابنەوە»

# لەبارەی
# بانگهێشتکردن بۆ ئەنجامدانی
# تاعەت و گوێڕایەڵی

«بەندە بەردەوام باوەش بۆ تاعەت و گوێڕایەڵیی خوا دەکاتەوە و هۆگری دەبێ و حەزی پێ دەکا و پێشی دەخا، تا وای لێ دێ پەروەردگار بە ڕەحمەت و بەزەیی خۆی فریشتەی بۆ دەنێرێ تا بەگەرمی هانی بدات و پتر پێداگر بێ لەسەر ئەنجامدانی تاعەت و عیبادەت. ئەو فریشتانە لەسەر جێگەی خەو و لە دانیشتن و مەجلیسەکاندا بێزاری دەکەن و وای لێ دەکەن مەیلی بۆ عیبادەت بچێتەوە»

«مادەم تۆ لە نوێژدای، کەواتە: بەردەوام لە دەرگەی پاشا دەدەی، کەسێکیش بەردەوام لە دەرگەی پاشا بدات، بۆی دەکرێتەوە»



«ئەگەر دڵ بە نووری تاعەت ڕووناک بوویەوە، ئەوا هەوری خێر و چاکە لە هەموو لایەکەوە ڕووی تێ دەکەن، خاوەنەکەی لە تاعەتێکەوە بۆ تاعەتێکی دیکە دەبەن، بەم جۆرە بەردەوام لەنێو تاعەت و عیبادەتدا دەمێنێتەوە»



«بەندە لە بەردەم پەروەردگاریدا دوو وەستانی هەیە: وەستانێک لە نوێژدا؛ وەستانێک لە ڕۆژی لیقا. هەرکەسێ هەقی وەستانی یەکەم بدات، وەستانی دووەمی لەسەر ئاسان دەبێ؛ هەرکەسێکیش کەمتەرخەم بێ لە وەستانی یەکەم و هەقی خۆی پێ نەدا، وەستانی دووەمی لەسەر قورس دەبێ. پەروەردگاری بەرز و مەزن دەفەرمووێ: الإنسان. واتە: هەندێ کاتی شەویش سوجدەی بۆ ببە و شەوگاریش تەسبیحاتێکی درێژی بۆ بکە، ئەو لەخوابێخەبەرانە شتی حازربەدەستیان حەز لێیە کە ڕابواردنی دنیایە و پاش مردنیان ڕۆژێکی قورس و گرانبار لەپاش خۆیان جێ دێڵن بێ ئەوەی هیچیان بۆ کردبێ، کە ئەویش ڕۆژی قیامەتە.»

«هەرکەسێ دەیەوێ لە دونیادا نیشتەجێی باخچەکانی بەهەشت بێ، با هاونشینی مەجلیسی زیکر بێ، مەجلیسەکانی زیکر باخچەکانی بەهەشتن»

«خێر و سەدەقە کاریگەرییەکی سەرسوورهێنەری هەیە لەسەر لاچوونی جۆرەها دەرد و بەڵا، تەنانەت ئەگەر خاوەنەکەی خراپەکار یاخود ستەمکاریان کافریش بێ! خوا بە هۆی خێر و سەدەقەکەیەوە جۆرەها بەڵای لەسەر لا دەبا. ئەمەش کار و فرمانێکی مەعلوم و زانراوە لەلایەن خەڵکەوە بەگشتی چ تایبەت بن، چ ڕەشۆکی. خەڵکی گۆی زەوی هەموویان دان بەو ڕاستییەدا دەنێن، چوونکە شتێکی ئەزموونکراوە و تاقییان کردۆتەوە»

«خانوو و باڵەخانەی بەهەشت بە هۆی زیکرەوە بونیاد دەنرێ، هەرکاتێ بابای زیکرکەر لە زیکرەکەی وەستا، فریشتەکانیش لە بونیادنانی خانووەکەی دەوەستن»

«نموونەی لەدایکبوون و گەشەکردن و زیادبوونی تاعەت، وەک دەنکێک تۆو وایە کە چاندووتە، دەبێتە درەخت، پاشان بەر دەگرێ، بەرەکەی دەخۆی، دەنکەکەی دەچێنی. هەرکاتێ شتێکی لێ بەر دەگرێ، بەرەکەی دەڕنی، دەنکەکەشی دەچێنییەوە. سەرپێچی و گوناهیش بە هەمان شێوە. کەسی عاقڵ و ژیر لەم نموونەیە ڕادەمێنێ، لە پاداشتەکانی چاکەکردن چاکەکەی دواییە، سزای خراپەش بریتییە لەخراپەکەی دوایی - چاکە چاکە بەدوای خۆیدا دێنێ و خراپەش بە هەمان شێوە»

«ئەگەر بەتەنیاش مایتەوە، پێچەوانەی ئارەزووی خەڵک و ڕووکردنە خوا و پێغەمبەرت(ﷺ) لا قورس نەبێ. خوا لەگەڵتە. تۆ لەژێر چاودێری و پارێزگاریی ئەودایت. تەنها یەقین و سەبرت لە بێژینگ دەدا و تاقیت دەکاتەوە»

«ماندووبوون بە ئەنجامدانی تاعەت و عیبادەت تێکەڵاوی جوانی و چاکی بووە. لە کوتاییدا لەزەت و ئیسراحەت بەرهەم دێنێ، هەرکاتێ ئەنجامدانی لەسەر نەفست قورس بوو، بیر لەوە بکەوە ماندووبوونەکەی کۆتایی دێ، بەڵام جوانی و لەزەت و خۆشییەکەی دەمێنێتەوە. هەردووکیان (ماندووبوونی ئەنجامدانی تاعەت لەگەڵ خۆشی و لەزەت و جوانییەکەی) بخە سەر تەرازوو، لەپێشترینیان پێش بخە»



«ئەنجامدانی تاعەت و عیبادەت بەبێ ئیخلاس، وەک ڕێبوارێک وایە تورەکەکەی پڕ کردبێ لە وردەبەرد، لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێ و دەیبا بەبێ ئەوەی سوودی لێ ببینێ»



«وەڵلاهی ئادەم سوودی لە عیززەت و شکۆی {اسْجُدُوا} و[١] ڕێزی {وَعَلَّمَ آدَمَ} و[٢] تایبەتمەندیی {لَمَّا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ} و[٣] شانازیی {وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي}[٤] نەبینی. بەڵکوو ئەوەی سوودی لێ بینی، بریتیی بوو لە {رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنْفُسَنَا...}[٥]»

«خۆشەویستترین دروستکراو لای خوا ئەوەیانە زۆر داوای لێ دەکات. خوا ئەو کەسانەی خۆش دەوێن کە زۆر پێداگری دەکەن لە داواکردن، هەرکاتێ بەندە لە پاڕانەوە و داواکردندا پێداگری بکات، خۆشی دەوێ و نزیکی دەخاتەوە و پێی دەبەخشێ»

---

(١) واتە: سوودی لەو شکۆ و ڕێزە نەبینی کە خوا بە فریشتەکانی فەرموو: سوجدەی ڕێزی بۆ ببەن.

(٢) واتە: سوودی لەو ڕێزە خواییە نەبینی کە خوا ناوی هەموو شتەکانی فێر کرد.

(٣) واتە: سوودی لەو تایبەتمەندییەش نەبینی کە جیا لە مەخلوقەکانی تر خودا دەفەرمووێ: بە دەستەکانی خۆم ئەوم دروست کرد.

(٤) واتە: سوودی لەو شانازییە گەورەیەش نەبینی کە خوا لە ڕۆحی خۆی فووی بەبەرداکرد.

(٥) واتە: کاتێ سنووری پەروەردگاری بەزاند و سەرپێچیی کرد، سوودی لەوانەی سەرەوە نەبینی، بەڵکوو ئەوەی سوودی لێ بینی ئەو هەست و شعوری بەندایەتی و ئەو پاڕانەوەیە بوو کە خۆی و خێزانەکەی کردیان و گوتیان: پەروەردگارا! ئێمە ستەممان لە نەفسی خۆمان کرد.

«ئەگەر پیاوێکی ماندوو و هیلاک بە بازرگانی و کڕین و فرۆشتن هەلێکی بێ گەڕان و ماندووبوونی کار و کەسابەتی لەدەست بچێ، کە بەهاکەی بیستوحەوت دینار بێ، ئەوا لەبەر پەشیمانی و داخ و حەسرەتی ئەو لەدەستچوونە هەردوو دەستەکانی خۆی دەگەزێ، ئەی چی دەڵێی بەرامبەر لەدەستچوونی نوێژێکی بەکۆمەڵ، کە پاداشتەکەی ئەوەندە زیاد دەبێ، زیاتر لە هەزار هەزار هەزار (واتە: هەزار ملیۆن) ڕەنگە خوا زیاتریشی بکات؟!»

«ڕووکردنە خوای بەرز و مەزن. ملکەچبوون بۆی. پێڕازیبوونی. دڵپڕبوون لە خۆشویستنی ئەو. خووگرتن بە زیکر و یادکردنی. دڵخۆشبوون و دڵکرانەوە بە ناسینی. پاداشتێک و بەهەشتێکی پێشخراوە بۆ بەندە. ژیانێکی لەم شێوەیە ئەوەندە بەرز و ناوازەیە، ژیانی هیچ پاشایەک پێی ناگات»

## لەبارەی هیممەتبەرزی

«بەربەستی عادەت و نەریت ئاسان بکە، ئەگەر ئەو هیممەتەی لە ناخ و دەروونی تۆدا هەیە تۆی بەرز کردەوە، ئنجا بەرزیت گەشە دەکا و دەر دەکەوێ. لەوێ ڕووناکییەکانی عەزیمەت و جددیەتت بۆ دەر دەکەوێ»

«پیاوچاکان و بۆخواسوڵحاوان بە هیممەتبەرزییان لە خەڵکانی ئاسایی جیا دەکرێنەوە، نەک بە ڕەنگ و شکڵ و شێوەیان»

«چەندەها جار پاداشت هاتۆتە دەرگات و لە بەردەرگاکەت وەستاوە، بەڵام دەرگەوانەکانت کە بریتین لە (دوایی) و (بەڵکوو) و (خۆزگە)، یەخەیان پێ گرتووە و نەیانهێشتووە بێتە ژوورەوە»

«گەورەترین قازانج لە دونیادا بریتییە لەوەی: هەموو کات نەفسی خۆت بەو شتانەوە سەرقاڵ بکەی کە بۆ قیامەتت لەپێشتر و بەسوودترن»

«ئەمڕۆ بازاڕ لەگۆڕێیە و هەڵنەگیراوەتەوە، پارەوپووڵ هەیە و کەلوپەل و پێویستییەکان هەرزانن، نەفسی خۆت بکڕەوە. ڕۆژێک بەسەر ئەو بازاڕ و کەلوپەلانەدا دێن بە کەم و زۆری ڕاناگەی. التغابن، واتە: ئەو ڕۆژە (کە ڕۆژی دواییە) ڕۆژی زیانبارییە. الفرقان، واتە: بیر لەو ڕۆژە بکەوە کە ستەمکار لە داخانا و لەبەر پەشیمانیی خۆی لەوەی کە لە دونیادا ستەمکاریی کردووە دەستی خۆی ئەگەزێ.»

«بە بڕیار و جددیبوون و پێداگیرییەوە لەم دونیا فانییە تەنگە، کە بەڵا و ئافەتگەلی زۆری لە خۆیدا هەڵگرتووە، بڕۆ دەرەوە. هەنگاو بەرەو فراوانی و کرانەوە بهاوێ -کە بەهەشتە- ئەو بەهەشتەی کە هەرگیز چاو وێنەی ئەوی نەبینیوە. ئەو بەهەشتەی کە هیچ داواکارییەک تێیدا ڕەت ناکرێتەوە و هیچ خۆشەویستێکت تێیدا لێت جیا نابێتەوە»

«هیچ چارێکت نییە، هەرچۆنێ بێ دووچاری وەنەوزی بێئاگایی و نوستنی هەوا و ئارەزوو دەبیت، بەڵام با خەوەکەت سووک و خەفیف بێ، نەک خەوێکی قووڵ»

«بەفیڕۆدانی کات لە مردن قورسترە، هەرچیی مردنە تەنها لە دونیا و خەڵکەکەیت دادەبڕێنێ، بەڵام بەفیڕۆدانی کات لە خوا و ئاخیرەتت دادەبڕێنێ»

«بەندە بەگوێرەی (نیەت، هیممەت، مەبەست، ئارەزووی لە ڕازیکردنی خوا، کارکردن بۆ دواڕۆژ) یارمەتی و مەدەد و چاودێریی خوایی بۆ پێش دێ. کەواتە: چاودێری و دەستگیرۆیی لەلایەن خواوە، بە ئەندازەی هیممەت و سەبات و ترس و ئارەزوو بۆ بەندە پێش دێت و پێی دەدرێ. زیللەت و سەرشۆڕییش بە هەمان شێوە، بە ئەندازەی ئەو شتانەی باسمان کرد بۆ بەندە پێش دێت و دووچاریان دەبێ»

«ئەوەی بۆ گەیشتن بە پێگە و ڕێز و گەورەیی گەرمیی هەتاوی نیوەڕۆیان نەچێژێ، ئەوا لەژێر سێبەری ڕێز و گەورەییدا پشوو نادا»

«هێزی تاسە و تامەزرۆیی بۆ گەیشتن بە هیوا و ئامانج، لە لایەک وا لە خاوەنەکەی دەکات بۆ ئەو شتانەی خوازیاریەتی کۆشش بکات، لە لایەکی دیکەوە وای لێ دەکات زۆر حەزەر بکات لە لە دەستدانی ئەو شتەی کە ئومێدەوارە بەدەستی بێنێ».

«هەرکەسێ ڕێگەی گەیشتن بە ئاخیرەت بە ڕێگەیەکی دوورودرێژ بزانێ و وا هەست بکا هێشتا زۆری ماوە پێی بگا، هەنگاوەکانی بەرەوخواچوونی بێهێز دەبن»

# لەبارەی
# هۆکارەکانی گوناح و سەرپێچی، بانگەوازکردن بۆ وازلێهێنانیان

«ئەگەر دڵ بە تاریکیی گوناهـ تاریک بوو، ئەوا لە هەموو لایەکەوە هەوری بەڵا و خراپەکاری ڕووی تێ دەکەن، خاوەنەکەی لە گوناهێکەوە دەبەن بۆ گوناهێکی تر، وەک شەوکوێرێک کە دووچاری شەوێکی تاریکی ئەنگوستەچاو بووبێ، خۆی بەملا و ئەولادا دەدا و دەستی لە هیچ شتێ گیر نابێ»

«هەندێ جار بەندە ئەوەندە گیرۆدەی گوناهـ دەبێ، ئولفەتی پێوە دەگرێ و حەزی لێ دەکا و پێشی دەخا، تا ئەوەی خوای گەورە شەیتانگەلێکی بۆ ڕەوان دەکات، کە ئەو شەیتانانە هانی دەدەن و گەرمی دەکەن لەسەر ئەنجامدانی گوناهـ و تاوان»

«گوناهەکان وەک برینی جەستە وان، لەوانەیە یەکێ لە برینەکان ببێتە مایەی لەناوچوون و مردن»

« بەرەنگاری خەیاڵ و خەتەرەی خراپ ببەوە، مەهێڵە بەسەرتدا زاڵ بێت، ئەگەر ڕووبەڕووی نەبیتەوە و بەرگری لە خۆت نەکەیت، ئەو خەیاڵ و خەتەرە خراپانە دەبنە شەهوەت و هیممەتی ئەنجامدانی گوناح، دیسان ئەگەر بە خۆت نەکەوی و قۆڵی لێ هەڵنەماڵی و بەرەنگاری نەبیتەوە بە دژەکەی، ئەوا لێت دەبێتە عادەت و نەریت. ئەو کات خۆلێدەربازکردنی لەسەرت قورس دەبێ و ناتوانی لەژێر باریدا بێیتە دەرەوە»

«گوناح گوناحی دیکە بەدوای خۆیدا دەهێنێ، یەکێکیان دەبێتە هۆکاری لەدایکبوونی ئەوەی تریان، تا وای لێ دێ لەسەر بەندە قورس و ناڕەحەت دەبێ وازیان لێ بێنێ. وەک هەندێ لە پێشینانمان گوتوویانە: لە سزاکانی گوناح ئەنجامدانی گوناحی دواترە، بە هەمان شێوە، لە پاداشتەکانی چاکە ئەنجامدانی چاکەی دواترە»

«چۆن بە عاقڵ هەژمار دەکرێ ئەو کەسەی بەهەشت بۆ شەهوەت و ئارەزووی ساتێکی کەمی دونیایی دەفرۆشێ!»

«هەموو گوناح و سەرپێچییەکان ئەم دوو وەسفەیان تێدا کۆ بۆتەوە: (دوژمنداری و ڕقوکینە) لەگەڵ (پشتهەڵکردن لە زیکر و یادی خوا و لە نوێژ). خۆشەویستی و مەحەببەت و ئولفەت بە ئیمان و کردەوەی چاکەوە گرێ دراوە، وەک پەروەردگاری بەرز و مەزن دەفەرمووێ: مريم، واتە: بەڕاستی ئەوانەی باوەڕیان بە خوا بووە و کاری چاکیان کردووە، خودای میهرەبان لەمەوپاش سۆز و خۆشەویستی و ڕێزی (تایبەتییان) بۆ ئامادە دەکات، (هەروەها لەلایەن فریشتەکان و ئیمانداران و نیشتەجێکانی بەهەشتەوە) خۆشەویست و ڕێزدارن.»

«هەرکەسێ ئەوەندە سام و هەیبەت و ویقاری پەروەردگاری لە دڵدا بێ کە نەتوانێ سەرپێچی بکات، خوا لە دڵی خەڵکیدا سام و هەیبەت و ویقاری پێ دەبەخشێ. خەڵکی وایان لێ دێ بچووکیی بۆ بکەن و خۆیان لەو بە بچووکتر سەیر بکەن»

«یەکێ لە گەورەترین سزاکانی گوناح و تاوان بریتییە لەوەی: ئەو گوناح و تاوانە پەیوەندیی نێوان بەندە و پەروەردگار دەپچڕێنێ. بەندەش ئەگەر نێوانی لەگەڵ خوادا پچڕا، ئەوا هەموو هۆکارەکانی خێر و چاکەی لێ دەپچڕێ، لەبەرامبەردا دەرگای هەموو شەڕ و خراپەیەکی بە ڕوودا دەکرێتەوە»

«ئارامگرتن لەسەر شەهوەت و ئارەزووی حەرام ئاسانترە لە ئارامگرتن لەسەر ئەو شتانەی دەبنە هۆکاری ورووژاندن و دروستبوونی شەهوەت و ئارەزووەکە»

«بەندە بە هۆی ئەنجامدانی گوناح و بێئاگابوون لە زیکر و یادی پەروەردگار، تووشی ئەم دەرد و بەڵا و ئافەتانەی خوارەوە دەبێ: سەرنەکەوتن و مۆفەقنەبوون لە کار و کردەوەدا، ڕاوبۆچوونی خراپ و نەگریس، شاردنەوەی حەق، خراپبوونی دڵ، بێبەرهەمی، کاتبەفیڕۆچوون، لێدوورکەوتنەوەی خەڵک، هەستکردن بە نامۆیی، وەڵامنەدرانەوەی دوعا، دڵڕەقبوون، نەمانی بەرەکەت لە ڕزق و لە تەمەن، بێبەشبوون لە زانست، بەرگ و پۆشاکی زەلیلی، سووکبوون و بێنرخبوون لە چاوی دوژمن، قیچکەتەنگی، تووشبوون بە بەڵا و تاقیکردنەوە لەلایەن کەسوکار و نزیکانی خراپ - کەسانێک کە دڵ بۆگەن دەکەن و کاتی ئینسان بەفیڕۆ دەدەن، غەم و خەفەتی بەردەوام، بارقورسی و ژیانتەنگی، لەشقورسی و تەمبەڵی. ئەم دەرد و بەڵا و ئافەتانە بە هۆی گوناح و بێئاگاییەوە سەر دەر دێنن و لەدایک دەبن. وەک چۆن تۆوی دانەوێڵە لە زەویدا بە هۆی ئاوەوە سەر دەر دێنێ و گەشە دەکات، هەروەها سووتان بە هۆی ئاگرەوە پەیدا دەبێ. دژی هەموو ئەمانەش، لە تاعەت و گوێڕایەڵیی خوادا لەدایک دەبێ»

«خۆشی و لەزەتی حەرام لە کاتی ئەنجامدانیدا لەگەڵ ناشیرینی و ناقۆڵایی تێکەڵ کراوە، دوای تەواوبوونیشی ئێش و ئازار بەدوای خۆیدا دێنێ، ئەگەر خۆشی و لەزەتی حەرام زۆریان بۆ هێنای، بیر لە تەواوبوونی لەزەتەکە و مانەوەی ناشیرینی و ناقۆڵایی و ئێش و ئازارەکەی بکەوە، پاشان هەردووکیان بەراورد بکە و تەماشای جیاوازیی نێوانیان بکە»

«هەرکەسێ لە پێناو خوادا واز لە لەزەتێکی حەرام بێنێ، لە قیامەتدا پاداشتەکەی بە تەواوترین شێوە وەر دەگرێتەوە، هەرکەسێکیش لێرە وەری بگرێتەوە، لەوێ لێی بێبەش دەبێ، یان بەتەواوی وەری ناگرێ، خوای گەورە هەرگیز لەزەتی ئەنجامدانی گوناحی وەک لەزەتی وازهێنان لێی، وەک یەک لێ نەکردوون»

«گوناح و خراپەکارییەکان نەخۆشین و دووچاری دڵ دەبن، وەک چۆن ئێش و ئازار و تا نەخۆشیی جەستەیین و دووچاری جەستە دەبن. نەخۆش سروشتی وایە، کاتێک بەتەواوی لە نەخۆشییەکەی چاک دەبێتەوە، وەک پێش نەخۆشییەکەی یاخود چاکتر لەپێش نەخۆشییەکەی نان دەخوات، وەک ئەوەی هەرگیز بێهێز و نەخۆش نەبووبێ. بە هەمان شێوە ئەنجامدەری گوناهیش کاتێ لە گوناهەکەی دەبێتەوە، دووبارە حەزی ئەنجامدانی گوناهی لەلا دروست دەبێ، وەک ئەوەی کەمێک پێش ئێستا گوناهی نەکردبێ»

«ڕۆژوو بریتییە لە بەڕۆژووبوونی ئەندامەکانی جەستە لە ئەنجامدانی گوناح و سەرپێچی. بەڕۆژووبوونی سکیش بریتییە لە خۆگرتنەوە لە خواردن و خواردنەوە. وەک چۆن خواردن و خواردنەوە ڕۆژووی سک دەشکێنن و نایهێڵن، بە هەمان شێوە گوناح و خراپەکارییش پاداشتەکەی ناهێڵن و بەروبوومەکەی خراپ و گەنیو دەکەن، تا دەگاتە ئەو ئاستەی وەک ئەو کەسەی لێ دێ کە بەڕۆژوو نییە»

## لەبارەی
## ماڵ و بەدەستهێنانی
## ڕزقوڕۆزی

«ئەی ئەو کەسەی داوای دەرگای بژێوی دەکەیت بەبێ کلیلی تەقوا، سکاڵا لەدەست تەنگدەستی و ژیانی کوللەمەرگیی خۆت دەکەیت، کەچی ڕێگەی هەڵە و گوناح و تاوانەکانت بەسەر خۆتدا فراوان کردوون»

«گوناحکردن بەربەستی دەرگای ڕزقوڕۆزی و کار و کەسابەتە، وەک خۆشەویستمان (ﷺ) فەرموویەتی: {وَإِنَّ العَبْدَ لَيَحْرِمُ الرِّزق بِالذَّنبِ يُصيبُهُ}[1]، واتە: بەندە بە هۆی گوناهێکەوە کە ئەنجامی دەدا لە ڕزقوڕۆزی مەحرووم و بێبەش دەبێ»

«ماڵ و سامان تا لەدەستت دابێ و نەچووبێتە نێو دڵت، هەرچەند زۆروزەبەند بێ زیانت پێ ناگەیەنێ، هەرکاتێکیش چووە نێو دڵت، ئەگەر هیچیشت لە دەستدا نەبێ، زیانت پێ دەگەیەنێ»

«ئەوەی خوا دەیداتە کەسی سەخی و چاوتێر و بەخشەر، نایداتە کەسی ڕژد و ڕەزیل و دەستقوچاو، ئەوەی یەکەمیان خوا ڕەوشت و ڕزق و ماڵ و منداڵ و هۆکارەکانی بژێویی بۆ فراوان دەکات، وەک پاداشتێک لە هەمان ڕەگەزی ئەو کارەی دەیکات، کە بریتییە لە خێرکردن و ماڵبەخشین و سەخاوەت»

---

(١) أخرجه الحاكم برقم (٦٠٣٨).

# لەبارەی دونیا و حاڵی بەندە تیایدا

«دونیا ڕێگوزارە و شوێنی مانەوە نییە، ئاخیرەت نیشتمانی هەقیقییە و شوێنی مانەوەیە، ئەو شتانەش کە ئینسان ئارەزوویان دەکا و ئومێدیان بۆ دەخوازێ، لە زێدی هەقیقی و شوێنی مانەوەدا خوازیارن، نەک لە ڕێگوزاردا»

«هەرکەسێ لە دونیا دەر دەچێ (دەمرێ)، یان ئەوەتا لە گرتووخانە ئازادی بووە، یان دەچێ بۆ گرتووخانە و بەند دەکرێ»

«ئەوەی لە دونیادا ڕابرد خەون بوو، ئەوەشی هێشتا ماوە و ڕووی نەداوە تەنها خۆزگە و تەمەنناکردنە، کاتیش لەنێوان ئەو دووانەدا بەفیڕۆ دەچێ»

«ئەی ئەو کەسەی شارەزایت و خاوەن عەقڵ و ئەزموونیت، تا ئێستا بەهای خۆت زانیوە؟ ئەم کەون و کائیناتە هەمووی بۆ تۆ دروست کراوە»

«خوای پەروەردگار ڕازیبوونی بەندە و ئەرخەیانبوونی بە ژیانی دونیا، لەگەڵ بێئاگابوون لە ماریفەت و وردبوونەوە و کارکردن بە ئایەتەکانی کردۆتە سەرچاوەی بەهیلاکچوون و بەدبەختی»

«ببە بە کوڕی ئاخیرەت، مەبە بە کوڕی دونیا، منداڵ شوێنکەوتە و چاولێکەری دایکیەتی»

«ڕەغبەت و ئارەزووکردن بۆ ئاخیرەت تەواو نابێ و ناچێتە سەر بەبێ زوهد و دونیابەکەمگری»



# لەبارەی قورئان و زانست و زانیاریی

«ئەگەر دەتەوێ سوود لە قورئان ببینی، ئەوا: لە کاتی خوێندنەوە و گوێبۆگرتنیدا دڵت لە شتی دیکە خاڵی بکەوە و هەموو تین و تاوێکی دڵت با بۆ قورئان بێ، گوێی بۆ قوڵاغ بکە بە جۆرێک لەگەڵ ئەودا حزوورت هەبێ، وەک ئەوەی بەتەنیا تۆ بدوێنێ. لە ڕاستیدا هەموو دواندنەکانی قورئان لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەیەوە(ﷺ) بۆ تۆیە»

«قورئان شیفای تەواوی لایە بۆ هەموو نەخۆشییە ڕۆحی و جەستەیی و دونیایی و قیامەتییەکان. کەسێ شیفا لە قورئان نەخوازێ، خوا بە هیچ شتێکی دیکە شیفای نادات»

«هەموو ئەو مەدح و ستاییشانەی لە قورئاندا بۆ بەندە هاتوون، بریتین لە بەروبوومی زانست و ماریفەت، هەموو ئەو سەرزەنشتانەش کە بەندەی پێ سەرکۆنە کراوە، لە جەهل و نەفامیی بەندەوە سەرچاوەیان گرتووە»

«باشترین شتێک دڵ بە دەستی بێنێ و بەندە بە هۆیەوە لە دونیا و ئاخیرەت پلە و پێگەی بەرز ببێتەوە، بریتییە لە: عیلم و ئیمان»

«ئەگەر زانست بەبێ کردەوە سوودی هەبووایە، ئەوا خوای پەروەردگار زەمی پیاوانی ئایینی ئەهلی کیتابی نەدەکرد، بە هەمان شێوە ئەگەر کردەوەش بەبێ ئیخلاس سوودی هەبووایە، سەرزەنشتی مونافیق و دووڕووانی نەدەکرد»

«ڕێزوپێزی زانست بەگوێرەی ڕێزوپێزی زانراوەکە و پێویستی و حاجەتی ئینسانە بەو شتە زانراوە، لەمەشدا هیچ زانراوێک لەپێشتر نییە بە ناسین و بوونی ماریفەت بە خوا و ئەو شتانەی پێویستە بزانرێن لەو پێناوەدا»

«زانست و زانیاری ئەوەندە ڕێزوپێز و گەورەییەی بەسە کە ئینسان لە پەروەردگاری جیهانیان نزیک دەخاتەوە و بە جیهانی فریشتانی دەگەیەنێ، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە عەزیزبوون لە دونیا و ئاخیرەت بەستراوەتەوە بە زانست و مەرجدار کراوە بە بەدەستهێنانی»

«پاکی بۆ ئەو خوایەی کە فەرماییشتەکانی خۆی کردوون بە:

دەرمانی دڵ.

ڕوونکەرەوەی ئیمان و ڕاستییەکانی ئیمان.

بانگهێشتکاری ژیانێکی ئەبەدی و بەهەشتێکی نەبڕاوە.

ڕێنوێنیکار بۆ ڕێگای ڕاست»

## لەبارەی ئاقیبەتچاکی و ئاخیرشەڕی

«کەسێ بەر لە سەلامدانەوەی نوێژ دەستنوێژی بشکێ، ڕکاتەکانی پێشتری بەتاڵ دەبنەوە، کەسێ بەر لە خۆرئاوابوون فتار بکاتەوە، ڕۆژووی هەموو ڕۆژەکەی لەدەست دەچێ، کەسێکیش لە کۆتایی تەمەنیدا ڕوو لە خراپە بکات، هەر بەو ڕووەوە دەچێتەوە لای پەروەردگار»

«گێلترین کەس ئەوەیە لە کۆتایی سەفەرەکەیدا گومڕا دەبێ، لە کاتێکدا لە کۆتا مەنزڵی نزیک بۆتەوە»

«ژیانی پاکوپوخت و حەقیقی ژیانی ئەو کەسەیە کە بەڕواڵەت و بەپەنهان وەڵامی خوا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) داوەتەوە، ئەوان هەمیشە زیندوون، ئەگەرچی بە جەستەش دونیایان جێ هێشتبێ، هەندێ لەوان بە مردوو هەژمار دەکرێن، ئەگەرچی بە جەستەش زیندوو بن»

«بەدبەختترین کەس ئەو کەسەیە کە مەحرووم و بێبەش دەبێ لە ڕەحم و بەزەیی خوای گەورە، ئەمە لە کاتێکدا ڕەحم و بەزەیی خوا هەموو شتێکی گرتۆتەوە»

«ئەگەر بە ڕاست و دروستی بڕیاری تۆبەت دا، تۆبەکەت لە ناخی دڵەوە هەڵقوڵا، ئەوا هەرچیی گوناح و خراپەکارییەکانی پێشووە هەمووت لەناو بردوون، وەک ئەوەی بوونیان نەبووبێ. خۆشەویست(ﷺ) فەرموویەتی: {ئەو کەسەی لە گوناح و تاوانان دەگەڕێتەوە و تۆبە دەکات، وەک ئەوە وایە هیچ گوناهی نەبووبێ}[1]»

---

(١) أخرجه ابن ماجة برقم (٤٢٥٠)، والطبراني برقم (١٠٢٨١).

# لەبارەی هۆکارەکان و ئەنجامەکانیان

«بناغە و بنچینەی خێر و شەڕ بریتییە لە: ڕامان و بیرکردنەوە، فیکر و بیر دەستپێک و سەرەتای ویست و خواستنە لە وەرگرتن و وازلێهێنان و خۆشویستن و ڕقلێبوونەوە»

«هەرکەسێ لە خەیاڵ و خەتەرە و فیکریدا نزم و پەست و سووک بوو، لە هەموو کارەکانی دیکەشیدا هەر وا دەبێ»

«مەگەر ئەوانەی پشک و بەشێکی گەورەیان پێ عەتا کراوە و مۆفەقن، ئەگەرنا هیچکەس مۆفەق و سەرکەوتوو نابێ لە ناسین و زانینی کلیلەکانی خێر و شەڕ و ڕەچاوکردنیان، خوای پاک و تاک بۆ هەر خێر و شەڕێک کلیلێک و دەرگایەکی داناوە، بە هۆی ئەو کلیلەوە لە دەرگاکە دەچێتە ژوورەوە، لەسەر بەندە پێویستە گرنگییەکی زۆر بدات بە ناسین و زانینی کلیلەکان، بزانێ ئاخۆ هەر کلیلەی بۆ کردنەوەی کامە دەرگا دانراوە»

«ویستراو و حەزپێکراوی ئەمرۆ، بەیانیی ناخۆشی و ناپەسندی بەدوای خۆیدا دێنێ؛ بە پێچەوانەوە، ناخۆشی و ناڕەحەتیی ئەمرۆ، بەیانیی ئیسراحەت و پشوو بەدوای خۆیدا دێنێ»

«لەو شتە هەرە گرنگانەی کە پێویستە بەندە پشکنینی بۆ بکا و بەدوایدا بگەڕێ، ناسینی ئەو شتانەیە کە بە هۆی کەوتنەنێویان و پیادەکردنیان کردەوە چاکەکانی پێ هەڵدەوەشێتەوە، بۆیە پێویستە زۆر سوور بێ لەسەر کردەوەکانی و حەزەریان لێ بکات»

«هەرکەسێ لە جیهان ڕابمێنێ و سەیری شەڕ و ئاشووب و ئاژاوەکانی بکات، بۆی دەر دەکەوێ هەموو شەڕ و خراپەیەکی ئەم جیهانە هۆکارەکەی سەرپێچیکردنی پەیامبەر(ﷺ) و دەرچوونە لە گوێڕایەڵیکردنی، هەموو خێر و چاکەیەکی ئەم جیهانەش هۆکارەکەی بریتییە لە گوێڕایەڵیکردنی»

# لەبارەی هاوڕێیەتی و شوێنەوارەکانی

«بەسوودترین کەس بۆ تۆ پیاوێکە دەرگای دڵی خۆیت بۆ دەکاتەوە و دەستت کراوە دەکات لە مامەڵەکردن لەگەڵیدا، تا ئەوەی خێرێک لە دڵیدا دەچێنی، یاخود چاکەیەکی لەگەڵ دەکەی، (بە پێچەوانەوە، کەسانێک هەن ناتوانی چاکەیەکیان لەگەڵ بکەی، ئەوەند داخراون، لە کاردانەوەکانیان دەترسی) ئەو جۆرە کەسە باشترین یارمەتیدەرە بۆ ئەوەی بە هۆیەوە سوودت پێ بگا و بەرەو کەماڵ و تەواوێتی بچیت، لە ڕاستیدا سوودگەیاندنت بەو، وەک سوودگەیاندنی ئەوە بە تۆ یاخود زیاتریش»

«ئەگەر بەندە دەیەوێ چاو لە کەسێک بکات، با سەیری ئەو کەسە بکات ئاخۆ لە ئەهلی زیکرە، یاخود لە بێئاگایانە؟ ئایا هەوا و ئارەزوو بەسەریدا زاڵە و حوکمی دەکات، یاخود وەحی؟ ئەگەر لەو کەسانە بوو کە هەوا و ئارەزوو بەسەریاندا زاڵە و حوکمیان بەسەردا دەکات، واتە: لە بێئاگایان بوو، ئەوا با باش بزانێ کارەکەی خۆبەزایەدان و خۆلەناوبردنە»

«حیکمەت و لێزانیی پەروەردگار وا دەخوازێ مرۆڤەکان هەندێکیان بە هۆی هەندێکی دیکەیانەوە کارەکانیان ڕایی ببێ و یەکتر تەواو بکەن، بۆیە چاریان نییە و پێویستیان بە یارمەتی و کۆمەکیی یەکتر هەیە»

«چ شتێک لەوە زیانی زیاترە بۆ بەندە کە هێندە کورتبین بێ، هەموو هیممەت و هەوڵێکی وەستابێتە سەر خۆچوواندن بەو کەسانەی لەگەڵیاندا تێکەڵە و لە هەمان ڕەگەزی ئەودان. هەروەها هەموو هیممەتێکی وەستابێتە سەر شانازیکردنی ئەوان بەو. واتە: هەرکاتێ بزانێ ئەوان شانازیی پێوە دەکەن، ئنجا هیممەتی زیاد بێ. ئەوان بۆ هەرلایەک بچن، ئەویش ڕێی ئەو لایە بگرێتە بەر؟! تەنانەت ئەگەر ئەوان بچنە نێو کونی مارمێلکەش، پێی خۆشە لەگەڵیاندا بچێ و بەدوایاندا ڕابکا»

# لەبارەی چەند شتێکی جۆراوجۆر

«پێغەمبەر(ﷺ) تەقوای خوا و ڕەوشتجوانیی بەیەکەوە کۆ کردۆتەوە، چوونکە تەقوای خوا نێوانی بەندە و پەروەردگاری چاک دەکات، ڕەوشتجوانییش نێوانی بەندە و خەڵک چاک دەکات، تەقوای خوا خۆشویستنی خوای بۆ دەست دەخات، ڕەوشتجوانییش وا لە خەڵک دەکات خۆشیان بوێت»

«کەسێ سوود لە چاوەکانی وەر نەگرێ، سوود لە گوێچکەکانیشی وەر ناگرێ»

«لە سیفەتەکانی گوێدرێژ کە بە ئاژەڵێکی کەمعەقڵ ناسراوە: پیاو ڕێی پێ تەی دەکات، لە شەوی تاریک و لە شوێنی دوورەوە پێی دەچێتەوە ماڵ و گوێدرێژەکە ماڵی خاوەنەکەی پێدەزانێ، خۆی ڕێگەی خۆی دەزانێ، هەروەها جیاوازی دەکات لەنێوان ئەو دەنگەی کە دەیەوێ ڕای بگرێ و بیوەستێنێ، لەگەڵ ئەو دەنگەی کە هانی دەدات بۆ ڕۆیشتن. بەڕاستی کەسێک ڕێگەی دوامەنزڵی خۆی پێنەزانێ کە بەهەشتە، زۆر لە گوێدرێژ کەمعەقڵترە»

«لە ئایەتەکانی خوا ڕابمێنە کە بانگی بەندەکانی دەکات بۆ بیرکردنەوە و تێڕامان، کردوونی بە ئایەتانێک کە بەڵگەن لەسەر کەماڵیی قودرەت و دەسەڵاتی، بەڵگەن لەسەر زانست و ویست و حیکمەت و موڵکی، بەڵگەن لەسەر یەکتایی ئەو لە پەروەردگارێتی و پەرستراوێتیدا، پاشان ئەو ئایەتانە لەگەڵ ئایەتەکانی کە باسی ئاخیرەت و بەهەشت و ئاگر دەکەن لە تەرازوو بدە، دەبینی ئەوەی یەکەمیان بەبەڵگەترین شتە لەسەر ئەوەی دووەمیان، شاهێدن بۆی، دەیانبینی لە یەک دەللاقەوە سەرچاوەیان گرتووە، لەلایەن یەک پەروەردگار و یەک دروستکراوەوە هاتوون، المؤمنون»

«بە هەمان شێوە حاڵی دووڕووان بەم شێوەیەیە کە نووری ئیمانیان بە نیفاق و دووڕوویی دەڕوا، گەرمیی کوفر و گومان و دوودڵی لە دڵیاندا دەمێنێتەوە، گومان لەنێو دڵیاندا دەکوڵێ، بە ئاگر و کوڵ و گەرمی و ئەزیەتی ئەو گومانانەش دڵەکانیان لەنێو دەچێ، لە دونیادا دڵەکانیان بە گومانگەلێکی هاوشێوەی ژەهر و ئاگر تەفروتونا دەبێ، لە قیامەتیشدا خوای پەروەردگار بە ئاگرێکی گەرمکەر و پەلاماردەر دڵەکانیان دەسووتێنێ»



# ناوەڕۆک